


زنجیرە وتاری (شیرك و شیركی گوێڕایەڵی كردن)

# الشرك وشرك الطاعة

## الدستـــور.. أحكام جاهـــلية

## دەستور .. حوكمانێكی جاهیلی


وتاری شیخ

تقبله الله

أبو علي الأنباري



وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ

بسم الله الرحمن الرحيم

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

بەناونیشانی

# دەستور.. حوکمانێکی جاهیلی

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ



الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله

خوایه حەقمان بە حەق پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر شوێنكەوتنی، وە باتڵیشیمان بە باتڵ پیشان بدە و یارمەتیمان بدە لەسەر ئەوەی لێی دووربكەوینەوە، خوایە ئەوەمان فێر بكە كە سوودمان پێدەگەیەنێت و سوودبەخشمان بكە بەوەی فێرمان دەكەیت، پەروەردگارا لەوانەمان بكەیت كە كار دەكەن بە زانستەكەیان، خوایە زانستەكەمان بكە بە بەڵگە و حوججە بۆمان ئەو ڕۆژەی بە دیدارت دەگەین و نەیكەیتە حوججە بەسەرمانەوە ئەی چاكترینی بە بەزەییان، ئەی پەروەردگارم سینەم ئاسوودە و گوشاد بكە و كاروبار و هەوڵ و كۆششم بۆ ئاسان بكە و گرێی زمانم بكەرەوە و زمانم گۆیا و پاراو بكە تا لە گوفتارم تێبگەن، پەروەردگارا كردەوەكانم چاك بكە و تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ بێت و هیچ بەشێكی تێدا نەبێت بۆ هیچ یەكێك لە دروستكراوانت، لە پاشاندا:

لە وانەی پێشوو بە فەزڵ و منەتی الله باسی لیژنەی نووسینەوەی دەستورمان كرد، وە هەندێك سیفەتی ئەم لیژنەیەمان سەلماند لە ڕێگەی ئایەتەكانی قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)و وتیشمان ئەوانە هەڵگەڕاونەتەوە لە دینی الله تعالی.

ئەمڕۆش بە ویستی الله تعالی قسەمان لەبارەی دەستورەوە دەبێت، ئایا حەقیقەتی دەستور چییە و حوكمی شەرعی چییە لەبارەیەوە ؟

پشتیوان بە الله عز وجل دەڵێم: هەروەك دەزانن كە ئینسان بونەوەرێكی كۆمەڵایەتییە و ناتوانێت بژی دوور لە نەوەی ڕەگەزی خۆی، وە بەهۆی ئەوەی لە كۆمەڵگەیەك دەژییێت بۆیە دەبێت تەشریعێك هەبێت ژیانی ئەو خەڵكە كۆبووەوە ڕێك بخات، ناكرێت لە كۆمەڵگەیەك بژین بەبێ ئەوەی تەشریعێك هەبێت لەویێ ژیانیان ڕێك بخات، ئەو تەشریعانەی ژیانی ئینسان ڕێك دەخات لە هەر كوێیەك هەبێ جا لە كۆمەڵگە بچووكەكان بێت یان لە كۆمەڵگە گەورەكان دابەش دەبن بۆ دوو بەش، یان شەریعەتێكی دابەزیوە لە لایەن الله تعالی ـەوە، یاخود ئەگەر شەریعەتی الله عز وجل ـیان دوورخستەوە لایەك ئەوا دەبینیت كە خۆیان هەندێك تەشریع بۆ خۆیان دادەنێن تاوەكو ژیانیان ڕێك بخات، كەوایە ئینسانیەت بێ تەشریع نین جا خوایی بێت یان دەستكردی ئینسان بێت، وە الله عز وجل دوایین پەیامی ناردووە بە شەریعەتی پێغەمبەر (ﷺ)كە بریتییە لە شەریعەتێك هەروەك دەزانن دەگونجێت و دەبێت بۆ هەموو كاتێك و بۆ هەموو شوێنێك و تاوەكو هەڵسانی قیامەت، ئەو قانونانەی كە دادەنرێن لەلایەن ئینسانەكانەوە شەریعەتی الله ـیان خستووەتە لایەك و قانون و دەستورانێكیان هێناوە، ئایا حەقیقەتی ئەم قانونانە و حەقیقەتی ئەم دەستورانە چییە ؟ هەموو قانونێك، هەموو دەستورێك بێجگە لە شەرعی

الله عز وجل هەر هەموویان بەبێ جیاكردنەوە حوكمانێكی جاهیلیەتە، بەڵگەی ئەمەش لە پەڕتوكی الله عز وجل ئەم وتەیەیەتی -تبارك وتعالی- لە سوڕەتی (المائدة) ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ۝٤٩ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝٥٠﴾[1] ، واتە: بێگومان زۆربەی خەڵكی یاخی و سەركەش و لە سنوور دەرچوون * ئایا ئەوانە حوكمی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناكەنەوە) كێ هەیە بەقەدەر الله حوكمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو كەسانەی كە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

چۆن ئەم ئایەتە بە بەڵگە دەهێنیتەوە لەسەر ئەوەی تەشریعەكانی غەیری خوایی هەموویان حوكمی نەفامیین ؟ دەوەستین لە لای هەندێك لە وشەكانی ئەم ئایەتە پیرۆزە، وشەی یەكەم: الله عز وجل لەم ئایەتەدا وشەی جاهیلیەتی باس كردووە پاشان باسی وشەیەكی تری كردووە دەفەرموێت: أحكام واتە ئەم نەفامانە كۆمەڵێك حوكمیان هەیە، جا ئەمە دوو وشەیە پاشان دوای ئەمە باسی ئەوەی كردووە كە زۆرێك لە خەڵكی ئەم حوكمە جاهیلیانەیان دەوێت، ئەمە وشەی سێیەم بوو، وشەی چوارەم لەم ئایەتە پیرۆزەدا: حوكمی الله ـیە -عز وجل- لەسەر ئەو كەسەی ئەم حوكمە جاهیلیانەی دەوێت بەوەی كە ئەوانە فاسیقن ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ۝٤٩ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝٥٠﴾ ، كەوایە لە سەرەتادا پێویستە بزانین مەبەست چییە لە جاهیلیەت، پاشان دوای ئەوە بزانین حوكمە جاهیلیەكان چیین، پاشان دوای ئەوە بزانین پەیوەندی ئەم ئایەتە بە دەستور و قانونە دەستكردەكانەوە چییە ؟ سەبارەت بە جاهیلیەت، ئیمام ئیبن حەجەر -رحمە الله- لە (الفتح)دا دەڵێت: "جاهیلیەت بەكاردەهێنرێت بۆ كاتی ڕابردوو و مەبەستیش لە پێش ئیسلامە و ڕێكخەری كۆتاییەكەشی بە زۆری تاوەكو فەتحی مەككەیە"، كەواتە ئیبن حەجەر -رحمە الله- پێناسەی جاهیلیەتی كرد بەوەی ئەو ڕۆژگار و كاتانەیە كە پێش ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)بوو، وە ئەم جاهیلیەتە و ئەم كاتەش بەردەوام بووە تاكو مەككە فەتح كرا، دوای ئەوەی مەككە فەتح كرا ئیتر ئەم سەردەمە كۆتایی هات، ئەمە لە لای ئیمامی ئیبن حەجەر -رحمە الله-، بەڵام تەحاوی -رحمە الله- لە (مشكل الآثار) لە موجاهید ـەوە -رحمە الله- نەقڵی كردووە كە وتویەتی: "جاهیلیەت نێوانی عیسا و محمد ـە -علیهما الصلاة والسلام-" ، كەوایە ماوە دیاریكراوەكەی نێوان عیسا -علیه السلام- تاوەكو ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)بە نسبیەت خەڵكی مەككە وتی ئەمە ماوەی جاهیلیەتە، كەوایە ئەم سەردەمە لە مێژوودا بە سەردەمی جاهیلی ناسراوە، وە بۆ سوودمەند بوون ئاماژە دەكەم بۆ بابەتێك، وەك ئاشكرایە بەعسیەكان ماوەیەك حوكمی ئەم وڵاتەیان كردووە، وە

[1] [المائدة: ٤٩ ، ٥٠]

ئەوانە ئاڕاستەيان نەتەوەيی بوو -پەنا بە الله-، كاتێك پێشكەوتووەكەيان لەو كاتەدا -ئەو تاغوتە-فەرمانی كرد بە دووبارە نووسينەوەی مێژوو، جا هاتنە سەر هەندێك وشە و زاراوە و ويستيان سەر لەنوێ دايڕێژنەوە، لە نێو ئەو زاراوانەش كە دايان ڕشتەوە: وشەی سەردەمی جاهيلی ـيان سڕييەوە و زاراوەيەكی نوێيان هێنا ناويان نا "سەردەمی پێش ئيسلام" چونكە ئەو نەتەوەپەرستيەی ديندارىيان پێدەكرد ڕەتی دەكردەوە و ڕازی نەبوو كە ئەو موشريكانەی سەردەمی زوو ئەوانەی مردن لەسەر شيرك ناوبنێ بە "جاهيليەت"، بۆيە ڕەتيان دەكردەوە و پێی قەڵس دەبوون كە بەكاربهێنرێت لەسەر عەرەب هەرچەندە لەو كاتەش بووبێت، وە لەسەر شيرك كە ناوبنرێت بە "جاهيلی"، جا ئەم زاراوەيەيان گۆڕی بۆ زاراوەی "سەردەمی پێش ئيسلام" بۆيە ئينسان پێويستە وريا بێت لەوەی نموونەی ئەم زاراوەيە بەكاربهێنێت چونكە ئەمە بەعسی بوو، سەبارەت بە زاراوە ئيسلامييەكان ئەوا ئێمە دەست هەر بەوانەوە دەگرين و ئەم سەردەمەش ناودەنێين بە "سەردەمی جاهيلی"، ئێستا زانيت كە (جاهيليەت) بريتی بوو لەو ماوە درێژبووەوەی پێش پێغەمبەر (ﷺ)بەڵگە چييە لەسەر بوونی ئەم سەردەمە ؟ لە پەڕتوكی الله تعالی دەست پێدەكەين ئەم وتەيەی (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ)، كەوايە الله عز وجل ئەمەی جێگيركرد كە جاهيليەتێك هەيە، هەروەها لە ئايەتی سوڕەتی (الأحزاب)﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾ ، ئاخاوتنەكە ئاڕاستەكراوە بۆ دايكانمان و ئافرەتانی موسڵمان لە ڕێگەی دايكانمان كە زينەت و جوانی خۆيان دەرنەخەن وەكو سەردەمی نەفامی يەكەم، بەدڵنياييەوە ئەم جاهيليەتە ناسراو بوو لەلای دايكانمان كاتێك ڕێگريان لێكرا لەوەی جوانی خۆيان دەربخەن وەكو خۆدەرخستن لە سەردەمی جاهيليەتدا، كەوايە ئايەتەكە ئاماژە دەكات بۆ سەردەمی جاهيلی نزيك لە سەردەمی ئيسلام، سەبارەت بە سوننەت لە فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)فەرموودەيەك كە ئيمامی موسليم -رحمه الله-گێڕاويەتيەوە لە حەجیماڵئاوايی كردن لە چوارچێوەی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: "بەڕاستی ڕيبای جاهيليەت پوچەڵ بووەتەوە و يەكەم ڕيباش كە هەڵم وەشاندووەتەوە بريتييە لە ڕيبای عەباسی كوڕی عبد المطلب" جا چ ناوێكی لێ نا ؟ فەرمووی: "بەڕاستی ريبای جاهيليەت هەڵوەشاوەتەوە" لەناو ئەو كەسانەی مامەڵەيان دەكرد بە ڕيبا، عەباسی كوڕی عبد المطلب بوو، جا ڕيبايەكی هەبوو و بە وەرگرتن و بەخشين لە جاهيليەتدا و پێغەمبەر (ﷺ)هەڵيوەشاندەوە بە ئيسلام، كەواتە پێش ئيسلام بريتييە لە جاهيليەت، ئەمە بەڵگەيەك، بەڵگەيەكی تر هەيە لە ئەبی هوڕەيرەوە (رضي الله عنه) كە ئەويش فەرموودەی عبد الله كوڕی مەسعودە (رضي الله عنه)دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: "من أحسن في الإسلام

لم يأخذ بما عمل في الجاهلية ومن أساء في الإسلام أخذ بالأول والآخر"[1] فەرموودەکە ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویەتیانەوە، واتە: هەر کەسێك چاکە بکات لە ئیسلامدا ئەوا لێی ناگیرێت بەوەی کردوویەتی لە جاهیلیەتدا، وە هەر کەسێك خراپە بکات لە ئیسلامدا ئەوا سەرەتا و کۆتاییەکەی لەسەر حیساب دەکرێت. کەوابوو پێش ئیسلام جاهیلیەتە، بە هەمان شێوە فەرموودەی ئەبی هورەیرە (رضي الله عنه)کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)کاتێك پرسیاری لێکرا لەبارەی باشترینی خەڵکیەوە فەرمووی: "خياركم في الجاهلية خياركم في الإسلام إذا فقهوا"، واتە: باشترینتان لە جاهیلیەتدا باشرینتانە لە ئیسلام ئەگەر تێبگەن. کەوابوو خەڵکانێك هەن لە جاهیلیەتدا باش و چاك بوون جا ئەو باش و چاکانە ئەگەر موسڵمان ببن ئەوا باش و چاکیش دەبن لە ئیسلام بەڵام بەو مەرجەی تێبگەن، کەواتە بەربەستی جیاکەرەوە لە ڕێگەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)بەوەی جاهیلیەت بریتییە لە پێش ئیسلام، وە دوای ئیسلامیش هەر بریتییە لە ئیسلام، ئەمە سەبارەت بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، صەحابەش باسی جاهیلیەتیان دەکرد و ناویان دەهێنا لەبەردەم پێغەمبەر (ﷺ) بەم تێگەیشتنە و هیچ جارێکیش ڕەخنەی لێ نەگرتن، لە نێو ئەو فەرموودانەش فەرموودەی عومەر (رضي الله عنه) دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا: من نەزرم کردووە لە جاهیلیەتدا بەوەی شەوێك بمێنمەوە بۆ عیبادەت لە مزگەوتی حەرام، پێغەمبەریش (ﷺ)پێی فەرموو: "نەزرەکەت بەجێبهێنە و شەوێك بمێنەوە"[2]، (إني نذرت في الجاهلية) کەوایە عومەر لە ماوەی جاهیلیەتدا ژیاوە و ئەو ماوەیەشی ناوبرد بە جاهیلیەت کە بەر لە ئیسلامە و پێغەمبەریش (ﷺ) نکوڵی لێ نەکرد، بۆیە شتەکە ناسراو بوو لە لای صەحابە کە ماوەی ژیانیان لە پێش ئیسلام بریتی بوو لە ماوەی جاهیلی، هەروەها فەرموودەی حەکیمی کوڕی حیزام (رضي الله عنه) دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خوا شتانێك هەبوون من ئەنجامم دەدان لە جاهیلیەتدا لە بەخشین و ئازادکردنی بەندە و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی جا ئایا هیچ پاداشتێکم بۆ هەیە ؟ فەرمووی: "موسڵمان بوویت لەسەر ئەوەی کردووتە لە خێر و چاکە" ئێستا موسڵمانە بەڵام شتانێك کە کردوویەتی لە جاهیلیەتدا لە بەخشین و ئازادکردنی بەندە و کۆیلە و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی، فەرمووی: موسڵمان بوویت لەسەر ئەوەی کردووتە لە خێر و چاکە"لە حەکیمی کوڕی حیزام ـەوە (رضي الله عنه)دەڵێت: جا وتم: "والله وازم لە هیچ شتێك نەهێناوە لەوانەی کردوومە لە جاهیلیەتدا ئیللا هاوشێوەی ئەو لە ئیسلامیش کردوومە"[3]،

[1] - متفق عليه -

[2] -متفق عليه- بوخاری و موسلیم -رحمهم الله- گێڕاویەتیانەوە

[3] بوخاری و موسلیم -رحمهم الله- گێڕاویەتیانەوە ئەمە لە لای بوخاری و موسلیم، وە زیادەکیش هاتووە لە لای موسلیم -رحمه الله-

کەوایە حەکیمی کوڕی حیزام (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)لەبەردەم پێغەمبەر (ﷺ)دانی نا بەوەی لە ماوەی جاهیلیەت ژیاوە و شتانێکی کردووە لە جاهیلیەتدا لە کاتێکدا ئەو لە ئیسلام دایە دەپرسێت ئایا چارەنووسی ئەو کردەوانەی کردوویەتی لە جاهیلیەتدا چییە ؟ کەوابوو بە هەمان شێوە صەحابە ئەم ماوەیەیان ناوبردووە بە ماوەی جاهیلی، هەروەها ئیمامی بوخاری -رحمه الله- لە صەحیحەکەیدا بەشێك هەیە دەڵێت: "باب إذا حلف - أو إذا نذر - أن لا يكلم إنسانا في الجاهلية ثم أسلم" ئەم بەشە ئیمامی بوخاری دایناوە هەروەك ئەوەی بیچەسپێنێت کە جاهیلیەتێك هەیە و دوای موسڵمان بوون و چوونە نێو ئیسلامیش شتێکی ترە، هەروەها ئیمامی موسلیم -رحمه الله- لە صەحیحەکەیدا باسی دوو لە تابیعیەکانی کردووە کە ئەوانیش: ئەبی عوثمانی نەهدی و ئەبی ڕافیعی سائیغ بوون، دەڵێت: ئەو دووانە لەوانە بوون بە جاهیلیەت گەیشتوون و هاوەڵیەتی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان (ﷺ)کردووە، کەواتە هەموو ئەوانەی باسم کرد بۆت دەسەلمێنێت لە ڕێگەی فەرموودەکانەوە کە ماوەی پێش ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)پێی دەوترێت سەردەمی جاهیلی، وە هۆکاری جەختکردنەوەم بەم بەڵگانە بەهۆی ئەوەیە چونکە بابەتەکە سادە وساکار نیە ئەمە باسی یەکەم

کەوایە لە ڕێگەی ئایەتەکە ئێستا تێگەیشتم لەوەی مەبەستی الله عز وجل چییە لە وشەی جاهیلیەت لە دەستەواژەی حوکمی جاهیلیەت، ئێستاش دێینە سەر باسی حوکمەکان، زانیمان کە ئەم ماوەیە بریتی بوو لە ماوەی جاهیلی جا ئایا مەبەست چییە لە حوکمەکانی جاهیلی ؟

الله عز وجل دەفەرموێت:﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ﴿٥٠﴾﴾کەوایە ئەو نەفامانە کۆمەڵە حوکمێکیان هەبوو جا ئایا ئەم حوکمانە چی بوون ؟ الله تعالى باسی لایەنێك لەو حوکمانە کردووە کە ژیانی موشریکەکانی ڕێکخستبوو لە جاهیلیەتدا لە نێو ئەو حوکمانەش جا دینی بووبێت یان دونیایی بووبێت بریتی بوون لە کۆمەڵە تەشریع و حوکمێك بۆ خۆیان دایاننابوو هەروەك (ابن كثير -رحمه الله-) لە تەفسیرەکەیدا وا دەڵێت، وەرگیراو بوو لە بۆچوونەکانیان و هەوەسیان، یەکێك لەو حوکمانەش بابەتی زیندە بەچاڵکردنی کچان بوو، لە سوڕەتی(النحل)الله تعالى دەفەرموێت﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾﴾ ،واتە: خۆ ئەگەر موژدەی بوونی کچ بدرێت بە یەکێك لەو نەفامانە، ڕووی گرژ و تاڵ دەبێت و ڕەش دادەگیرسێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە لە داخ و خەفەتی ئەو موژدە ناخۆشە، خۆی دەشارێتەوە لە خەڵکی و بەتەنها(بیر دەکاتەوە):ئایا بیهێڵێتەوە بە زەلیلی و سووکی و بێ نرخی،یاخود زیندە بەچاڵی بکات و بیخاتە توێی خاکەوە، ئاگادارбن،ئای کە چەندە خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن.

كەوایە ئەمە بوو كە خەڵكی جاهیلیەت دینداریان پێدەكرد لە حوكمەكانیان كە پیاوێكیان ئەگەر كچێكی پێ ببەخشرایە بیری دەكردەوە -هاوكات لەگەڵ ئەوەش نیشانەكانی بێزار و خەمبار بوون دەردەكەوت لەسەر ڕووخساری و كاتێكیش بە لای كۆمەڵێكدا بڕۆیشتبایە هەوڵیدەدا ڕێگاكەی بگۆڕێت تاوەكو بەلایاندا تێنەپەڕێت- ﴿يَتَوَارَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ﴾، وە لەو كاتەدا بیری دەكردەوە كە ئایا بیهێڵێتەوە و بەخێوی بكات بە سوكی و شەرمەزاریەوە یان زیندە بەچاڵی بكات، كچەكە زیندە بەچاڵ دەكرا بە زیندوویی، وە ئایەتی دووەمیش كە جەخت لەم تەشریعە دەكاتەوە ئەم وتەیەی الله تعالى یە ﴿وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ٨ بِأَيِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ٩﴾[1] واتە: كاتێك كچی زیندە بەچاڵكراو پرسیاری لێ دەكرێت * بە چ گوناهێك، بە چ تۆمەتێك كوژرا ؟!. وە ئایەتی تر كە جەخت لەم واتایە دەكاتەوە لە سوڕەتی (الأنعام) الله تعالى دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ.... ١٣٧﴾ ، واتە: وەك ئەو دابەشكردنە دوور لە دادپەروەریە، بت و پەرستراوەكانیان كوشتنی منداڵەكانیان بۆ زۆربەی هاوەڵگەران جوان و ڕازاوە كردبوو...

كەوایە بابەتەكە ئێستا تەشریعە، زیندە بەچاڵكردنی كچان تەنها لە هەوا وهەوەسیانەوە نەبوو بەڵكو پەرستراوەكانیان بۆیان جوان كردبوون كە كچەكانیان بكوژن یان بیاننێژن هەر بۆیە شاعیریان دەڵێت:

وإني ليساق إلي المهر ألف وعبدان وذود عشر وأحب أصهاري إلي القبر

دەڵێت من مارەیی هەزار لە پارە وسامان و دوو كۆیلە و دە وشترم بۆ بێنن - دەڵێت بەڵام خۆشەویسترین نزیكەكانم بەلامەوە گۆڕە، كەوابوو ئەمە لە تەشریعەكانی جاهیلیەتی پێش ئیسلامە، وە لە تەشریعەكانی تردا، پیاوێك ناوی (عمرو بن لحي) بوو، پێغەمبەر (ﷺ)لەبارەی ئەم پیاوە فەرموویەتی: "رأيت عمروا بن عامر بن لحي الخزاعي يجر قصبه في النار"[2] ، واتە: من (عمرو بن لحي الخزاعي)ـم بینی ڕیخۆڵەكانی بەدوای خۆیدا ڕادەكێشا لە ئاگر. ئەم كەسە هەندێك تەشریعی بۆ دانان، لە نێو ئەو تەشریعانەش: بتەكانی لە شامەوە هێنا و خەڵكی جەزیرەی -جەزیرەی عەرەب- ناچاركرد ئەم بتانە بپەرستن، بڕیاری دا وشتر گوێی ببڕدرێت یان بەڕەڵا بكرێت و بەرخۆڵەی مەڕەكان بۆ بتەكان سەر ببڕدرێت، و وشتری نێر ئازاد بێت، ئەمانە لەو تەشریعانە بوون كە (عمرو بن لحي) بۆی دانان و هەمووشی پەیوەست بوو بە ئاژەڵەكان كە وازیان لێ دەهێنان بۆ خواكانیان و هەر بۆیەش الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ

[1] [التكوير: ٨ ، ٩]،

[2] – صحيح البخاري ولمسلم نحوه –

﴿ٱلْكَذِبَۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ١٠٣﴾[1]، کەوابوو الله بڕیاری ئەوەی نەداوە کە وشتر گوێی ببڕدرێت یان بەڕەڵا بکرێت، یان بەرخۆڵەی مەڕەکان بۆ بتەکان سەر ببڕدرێت، یان وشتری نێر ئازاد بێت، جا ئەم زاراوانە و ئەم تەشریعانە هەبوون لە جاهیلیەتدا هەروەها حوکمانێکی تر کە الله عز وجل باسی کردووە ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ... ١٣٦﴾[2]، واتە: (ئەو هاوەڵگەر و نەفامانە) هەندێك لەوەی کە الله دروستی کردووە لە بەروبوومی کشتوکاڵ و ماڵاتیان کردووە بە بەشی خوا و وتویانە: ئەمە بەشی خوایە بە خەیاڵی خۆیان (هەندێکی تریشیان جیا کردۆتەوە و وتویانە) ئەمەش بۆ بتەکانمانە.!

بە هەمان شێوە ئەمەش لەو تەشریعە بەربڵاوانە بووە لەو ماوەیەدا، هەندێك تەشریعیان هەبوو پەیوەست بوو بە دین، هەروەها لە بابەتی حەج، خەڵکی مەککە بەپێی ئەوەی خەڵکی حەڕەم بوون دەرنەدەچوون بەرەو عەرەفە چونکە عەرەفە لە دەرەوەی حەڕەم بوو بۆیە دەیانوت ئێمە ئەهلی مزگەوتەکەین هەر لەناو مزگەوتەکە لەناو حەڕەم دادەبەزین و دەگەڕێینەوە نەدەچوونە دەرەوەی سنووری حەڕەم بۆیە الله عز وجل ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ... ١٩٩﴾[3]، ئەمە لەو حوکمە زاڵ و بڵاوانە بوو و الله تعالى ئەمەی ڕوون کردەوە و ئەم حوکمانەی هەڵوەشاندەوە، هەروەها کەسی قورەیشی بەو جلوبەرگەی لەبەری بوو تەوافی دەکرد، بەڵام ئەگەر پیاوێك لە دەرەوەی حەڕەم بهاتبایە دەبوو یان بە پۆشاکی نوێ بێت یان پۆشاکێك بخوازێت لە خەڵکی مەککە، بەهۆی ئەوەی گوایە ئەم پۆشاکانە سەرپێچی الله عز وجل ـیان پێکراوە بۆیە بۆیان نەبوو تەواف بکەن بەو پۆشاکانەی پێی هاتبوون جا ئەگەر پۆشاکێکی دەست بکەوتایە لە قورەیشییێك لەناو مەککە ئەوا تەوافی دەکرد بەم پۆشاکە، بەڵام ئەگەر دەستی نەکەوتبایە ئەوا بە ڕووتی تەوافی دەکرد جا پیاو بوایە یان ئافرەت -پەنا بە الله- تەنانەت ئافرەت بە ڕووتی تەوافی دەکرد، وە ئافرەتێکی جوان دەهات لە ماڵی الله تعالى تەوافی دەکرد و پۆشاکێکی دەست نەدەکەوت لە هیچ کەسێك ئینجا دەستی بە تەواف دەکرد بە ڕووتی، جا لەوەی کە مێژوونوسان گواستویانەتەوە لەوەی کە دەیوت: اليوم يبد بعضه أو كله وما بدا منه فلا أحله

ئەمانە تەشریعەکانی جاهیلی بوون پەنا بە الله، بە هەمان شێوە لە بابەتی هاوسەرگیری، ئیمامی موسلیم -رحمه الله- باسی کردووە کە دایکمان عائیشە (رضي الله عنها)باسی چوار چینی کردووە لە مارەبڕین لە

[1] [المائدة: ١٠٣]

[2] [الأنعام: ١٣٦]

[3] [البقرة: ١٩٩]

جاهیلیەتدا، جا باسی یەکێك لەو چینانەی کردووە و دایکمان ناوی ناوە بە "إستبضاع" واتە پیاو ئەگەر ئافرەتەکەی پاك بووەوە لە حەیز پێی دەڵێت: برۆ بۆ لای فلان و داوای جووت بوونی (جماع) لێ بکە، جا خانەدان و خاوەن پلە وپایەکانیان هەڵدەبژارد لە ناوچەکەدا، پاشان هاوسەرەکەی دەنارد تاوەکو جیماع بکات لەگەڵ ئەم پیاوە، ئینجا کاتێك دەگەڕایەوە پیاوەکەی ماوەیەك خۆی لێ بەدوور دەگرت تاوەکو سکپڕیەکەی ڕوون دەبووەوە، جا کاتێك سکپڕ دەبوو ئەگەر بویستایە بچێتە لای، دەچووە لای چونکە ئەوان بەدوای خانەدانی و شکۆییەوە بوون لە منداڵەکەیان، ئەمەش جۆرێك بوو لە هاوسەرگیری و تەشریعێك بوو کە لەو کاتەدا هەبوو، وە دایکمان عائیشە باسی ئەمەی کرد.

جۆرێکی تر لە مارەبڕینی جاهیلی کە هەبوو دەڵێت: کۆمەڵێك پیاو کەمتر لە دە کەس کۆدەبوونەوە لەگەڵ ئافرەتەکە جا کاتێك سکپڕ دەبوو پاشان منداڵەکەی دەبوو بەدوای ئەوانەی دەنارد و هیچ یەکێکیشیان نەیدەتوانی دوا بکەوێت، پاشان یەکێکی لەوانە هەڵدەبژارد و دەیوت: تۆ ئەی فلان باوکی ئەم منداڵەیت، وە نەیدەتوانی نکوڵی لێ بکات بۆیە ئیتر منداڵەکە دەدرایە پاڵ ئەو پیاوە -بە هەمان شێوە تەشریع بوو-، هەروەها دایکمان عائیشە باسی جۆرێکی تری کردووە لە هاوسەرگیری دەڵێت: پیاوان دەچوونە لای هەندێك ئافرەت -کە داوێنپیس بوون- وە هەر یەکێکیان ئاڵایەکی دادەنا لەسەر دەرگاکەی و بە خاوەن ئاڵاکان ناسرابوون -کە داوێنپیس و لەشفرۆش بوون- واڵایان دەکرد بۆ ئەوەی بیانویستایە لە پیاوان بەڵام ئەگەر سکپڕ بووایە و منداڵێکی بخستایەوە ئەوا دەینارد بەدوای "قافە" و قافەش بریتی بوون لە کەسانێك دەیانتوانی لە ڕێگەی سەیرکردن و سەرنجدان لە هەندێك نیشانە بڵێن ئەمە کوڕی فلانە و یان ئەمە کوڕی فلانە، بۆیە قافەیان دەهێنا، سەیری ئەو منداڵەی دەکرد و قافەش ئەم منداڵەیان دەدایە پاڵ ئەو کەسەی بەلایانەوە سیفەتی لێکچووی هەبوو لە نێوان ئەو و یەکێك لەوانەی هاتوونەتە لای ئافرەتەکە، ئەم تەشریعانە هەموویان بەربڵاو بوون و لە نێو ئەو مارەبڕینانەی کە زاڵ و بەربڵاوبوو ئەوەی ناسراوە ئێستا لە مارەبڕینی موسڵمانان جا پێغەمبەر (ﷺ)هەموو ئەو مارەبڕینانەی پەکخست و نیکاحی ئیسلامی پەسەند کرد.

کەوایە ئێستا جاهیلیەت هەیە و حوکمانێکیش هەن بۆ ئەم جاهیلیەتە ئەمەیە مەبەستی الله عز وجل لە پێشدا (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ) ئێستاش دێینە سەر وشەی سێیەم کە دەفەرموێت (يَبْغُونَ) بە واتای دەیانەوێت، کاتێك توێژینەوە دەکەی لە دەربارەی ئەم وشەیە لە زەوی واقیع لەو ماوەیەدا دەگەڕێیتەوە بۆ کاتی ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)تاوەکو مەککە فەتح کرا، لەو کاتەوەی پێغەمبەر (ﷺ)ئەم پەیامەی هەڵگرتبوو خەڵکی مەککە دژی دەوەستانەوە و بەرهەڵستیان دەکرد، قبوڵیان نەدەکرد لە عەقیدەدا الله عز وجل بە

تاك وتەنها بپەرسترێت بەڵكو دەیانەویست خوایە باتڵەكان و بتەكان بپەرسترێن، لەو ژمارە زۆرەی بتەكان كە لە دەوری كەعبە هەبوون، كەواتە (یبغون) ئەو حوكمانەیان دەویست و بە یەك گرتنی الله عز وجل ـیان نەدەویست، پاشان دوای ئەوەی كۆچی كرد بۆ مەدینە و حوكمە شەرعییەكان دابەزین، خەڵكی مەككە و خەڵكی جەزیرە ئەو حوكمانەیان نەدەویست كە بە وەحی هاتبوونە خوارەوە لە لایەن الله ـەوە -عز وجل-، بەڵكو پێداگر بوون لەسەر ئەوەی حوكم بكەن بەو حوكمە جاهیلیانە، لەبارەی هۆكارەكەشیان بۆ مانەوە لەسەر حوكمەكانی جاهیلی و دوورخستنەوەی حوكمەكانی شەرعی الله عز وجل ئەوا بە جەنگ كردن بوو، خەڵكی مەككە دەجەنگان لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) و دەجەنگان لە دژی صەحابە تاوەكو بمێنن و حوكم بكەن بەو حوكمە جاهیلیانە، ئەگەر سەرژمێریەكت بكردایە كە ئایا چەندە لە خەڵكی جەزیرە جاهیلیەتیان دەویست و چەندەیان حوكمەكانی شەرعی خواییان دەویست، ئەوا دەتبینی كە زۆربەی خەڵكی جاهیلیەت ئەو حوكمە جاهیلیانەیان دەویست لێرەوە الله عز وجل دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾ دوای ئەوەی ئەم وردەكاریەت زانی لەبارەی ئەم بابەتەوە ئایا پەیوەندی ئەوەی باسمان كرد چییە بە دەستور و قانون ؟

لە ئیبن عەباس ـەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)كە ئیبن حەجەر -رحمه الله- لە فەتح باسی كردووە، لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت ( وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ ) ئیبن عەباس دەڵێت "ئێمە دەمانوت جاهیلیەتێكی تر دەبێت و دێت" چۆن یەكێكی تر دەبێت ؟ دەڵێت: مادام الله عز وجل فەرموویەتی جاهیلیەتی سەرەتا بۆیە كە سەرەتای هەبێت ئەوا كۆتاییشی هەیە، ئەمە تەفسیری ئیبن عەباس هەروەك ئیبن حەجەر -رحمه الله- گواستویەتیەوە، ئەم حوكمانەی كە حوكمی بەندەكان و وڵاتی پێدەكرێت لە وڵاتانی موسڵمانان ئایا حوكمانێكی جاهیلیە ؟ ئایا ئەم سیفەتی جاهیلیەتە كورتكراوەتەوە لەو حوكمانە یاخود سیفەتی جاهیلی دەچەسپێت بەسەر ئەو حوكمانە و ئەو قانونانەش كە ئێستا حوكمی موسڵمانانی پێدەكرێت ؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستە بەراوردێك بكرێت لە نێوان حوكمە زاڵبووەكان لە پێشوودا و حوكمە زاڵبووەكان لە ئێستادا جا ئەگەر ڕووەكانی لێكچوونمان دەست كەوت لە نێوان ئەو حوكمە جاهیلیانە لە لایەك و قانون و دەستورەكانیش لە لایەك، وە بەشانێكی هاوبەشمان لە نێوانیاندا دەست كەوت ئەو كاتە دەڵێین سیفەتی جاهیلی دەچەسپێت لەسەر ئەو حوكمانەش و بە هەمان شێوە دەچەسپێت لەسەر ئەم حوكمانە، لەبارەی بواری بەراوردكردنەوە دەبێت تەنها لە خاڵە سەرەكیەكان بێت بەبێ چوونە نێو وردەكارییەكان چونكە بەستە كە بەشە هاوبەشەكان بزانیت لە نێوان جاهیلیەتی دوێنێ و ئەم قانون و دەستورانە لە خاڵە

سەرەکیەکان، وە یەکەم خاڵ لەسەری بوەستین بابەتی عەقیدەیە کە لە مەترسیدارترین بابەتەکانە؛ چونکە لەژێر تیشکی ئەو بڕیار لەسەر چارەنووسی ئینسان دەدرێت لە ڕۆژی قیامەت یان بەرەو خۆشگوزەرانی بەهەشتە و یان بەرەو دۆزەخێکی بلێسەدارە -پەنا بە الله- عەقیدە لە جاهیلیەتی دوێنێ - کاتێك دەڵێم لە دوێنێ مەبەستم ئەو حوکمانەیە کە زاڵ و بەربڵاوبوو لە سەردەمی جاهیلی- لە جاهیلیەتی دوێنێ خەڵکی ئازادی بیروباوەڕیان پەیڕەو دەکرد بێ ئەوەی ئەمە بنوسنەوە لە ماددەیەکی قانونی، چۆن ؟ لە مەککە الله تعالی شکۆدار و گەورەی بکات، بیروباوەڕی زاڵبوو بریتی بوو لە پەرستنی بتەکان، ئەمە لە مەککە و چەند بەشێك لە جەزیرەی عەرەب، بەڵام بیرت نەچێت کە ناوچەی نەجران و ناوچەکانی هۆزی (طي) ئەوانە دینداریان دەکرد بە دینی نەسڕانیەت (إنَّ الله ثالث ثلاثة) ئەمە عەقیدەیەکە و ئەویش عەقیدەیەك، وە هەروەها لە (يثرب) عەقیدەی زاڵ و بەربڵاو لە پاڵ شیرك بریتی بوو لە عەقیدەی جوولەکە ئەمەش بە هەمان شێوە لەناو جەزیرە، بەڵام لە باشووری جەزیرە لە ناوچەکانی یەمەن عەقیدەی بەربڵاو بریتی بوو لە عەقیدەی مەجوس و ئاگرپەرستی، کەوایە ئەمە جەزیرە بوو بەم شێوە و شێوازە، عەقیدەکان جۆراوجۆر و دابەش ببوون لە بەشەکانی جەزیرە جا هیچ کەسێك بەرهەڵستی هیچ کەسێکی تری نەدەکرد بۆیە هەر کەسێك بیویستایە ببێتە جوولەکە دەبوو بەو، وە هەر کەسێك بیویستایە ببێتە نەسڕانی دەبوو بەو، وە هەر کەسێك بیویستایە ببێتە ئاگرپەرست دەبوو بەو، وە هەر کەسێك بیوستایە بت بپەرستێت وای دەکرد، هیچ یەکێك بەرهەڵستی یەکێکی تری نەدەکرد و دژی نەدەوەستایەوە، کەوابوو ئازادی عەقیدە پەیڕەو دەکرا لەناو جەزیرە بەبێ ئەوەی بنوسرێتەوە بە چەند ماددەیەکی قانونی، وە ئازادی عەقیدە پێناسەی دەکەم بەم شێوەیە: فرە جۆری پەرستراو لەگەڵ ئازادی هەڵبژاردن، ئەمە پێناسەی منە بۆ ئازادی عەقیدە، ئەم ئازادیە ئێستا دەقی لەسەرە لە قانونەکان، ئێستا هیچ دەوڵەتێك نیە حوکم بکات بە دیموکراسی ئیللا دەستور و قانونی ئەو وڵاتە دەقی نوسیوە لەسەر ئازادی عەقیدە، ماددەیەکم نووسیوەتەوە لە قانونی عێراقی، ئەم قانونەی لەبارەیەوە وتیان بەڵێ لە ١٥- ١٠ - ٢٠٠٥ ماددەی دووەم (دووەمیان) ئەمە دەقی دەستوری عێراقییە، دەقەکە دەخوێنمەوە دەڵێت ئەمە نووسینەوەی لیژنەی نووسینەوەی دەستور و تەشریعەکەیانە- : "ئەم دەستورە پاراستنی ناسنامەی ئیسلامی بۆ زۆربەی گەلی عێراقی دەستبەر دەکات، هەروەك تەواوی مافە دینیەکان دەستبەر دەکات بۆ هەموو تاکەکان لە ئازادی عەقیدە و پەیڕەوکردنی دینی، وەك مەسیحیەکان و ئێزیدیەکان و سابیئە مەندائیەکان" دەقی ماددەکە کۆتایی هات، کەوایە بینیت کە ماددەی دووەم لە دەستوری عێراقی (دووەمیان) بۆ هەموو دینەکان ئازادی عەقیدە و ئازادی پەیڕەوکردنی دروشم و ڕێوڕەسمەکانیان فەراهەم دێنێت، واتە ئێزیدی دینەکەی دان پێدانراوە، مەسیحی دینەکەی دان پێدانراوە، سابیئی کە

هەسارەکان دەپەرستێت ئەمەش بە هەمان شێوە دینەکەی دان پێدانراوە، بەڵکو قانون ئازادی عەقیدە و ئازادی پەیڕەوکردنی عەقیدەیان بۆ فەراهەم دێنێت، جا ئایا چ جیاوازیەك هەیە لە نێوان قانونی جاهیلی دوێنێ و قانونی جاهیلی ئەمڕۆ! وە ڕوون و ئاشکراترین وێنە و نموونە لەو حکومەتانە بۆ بابەتی فرە دینی - لەسەر ئەوەی بۆ هەموو کەسێك هەیە مافی ئەوەی پەیڕەوی دینەکەی و عەقیدەکەی و دروشمەکانی بکات- ئەوەی ناسراوە بە وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی، ناوی نانێن ئیسلامی، ناوێرن! پێویستە ناوی بنێن ئایینی، بۆچی ؟ چونکە قانون دان دەنێت بە هەموو دینەکانی هەیە لە وڵاتدا، بۆیە وەزارەتی ئەوقاف قۆرغ نەکراوە بۆ موسڵمانان بەڵکو ئێزیدی ئەگەر بیەوێت پەرستگایەك دروست بکات بۆ شەیتانەکەی پاشان بچێتە لای وەزیری ئەوقاف ئەوا وەزیری ئەوقاف لە پارە و سامان بۆیان خەرج دەکات هەروەك خەرجی دەکات بۆ مزگەوت، ڕافیضی ئەگەر بیەوێت حوسەینیەیەك دروست بکات کە تیایدا شیرك بۆ الله عز وجل بڕیار دەدرێت و لەخۆدان دەکرێت و لەعنەت لە صەحابە دەکرێت و جنێو دەدرێت و تەکفیری موسڵمانان دەکرێت ئەوا بڕێك پارەی بۆ تەرخان دەکرێت بە ئەندازەی ئەوەی دەدرێت بە موسڵمانان ئەگەر بیانەوێت مزگەوتێك دروست بکەن، وە هەروەها مەسیحی مافی هەیە لەم وەزارەتە چونکە دامەزراوە لەسەر دینەکان نەك لەسەر ئیسلام کەوابوو ئەمە ئەو ماددەیە بوو و ئەمە ئەو وەزارەتە بوو کە دەیسەلمێنێت ئەو وڵاتانە حوکم دەکەن بە ئازادی عەقیدە بۆیە هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان قانونی جاهیلی دوێنێ لە ئازادی بیروباوەڕ و قانونی جاهیلی ئەمڕۆ، ئەمە لە بواری بیروباوەڕ، کەوایە بابەتی یەکەم لە بەراوردکردنەکەدا وتمان ئازادی عەقیدەیە، ئینجا دێینە سەر حەڵاڵ و حەڕام تاوەکو بەراوردێك بکەین لە نێوان قانونی جاهیلی دوێنێ و قانونی جاهیلی ئەمڕۆ بۆ ئەوەی ببینین کە ئایا سیفەتی جاهیلی کورت دەبێتەوە لەو حوکمانە یاخود ئەم حوکمانەی ئێستاش بە هەمان شێوە بە جاهیلی لە قەڵەم دەدرێن ؟ لە بابەتەکانی حەڵاڵ و حەڕام یەکەم بابەت کە لەسەری بوەستین بریتییە لە بابەتی ئارەق -پەنا بە الله- ئارەق لە جاهیلیەتدا دروست دەکرا بێ ئەوەی هیچ یەکێك بەرهەڵستی یەکێکی تر بکات، هەر کەس بیویستایە دروستی بکات ئەوا دروستی دەکرد، وە بازاڕیان هەبوو بۆ فرۆشتنی ئارەق، و ئارەقیان هەڵدەگرت لەماڵەکان هیچ کەسێکیش بەرهەڵستی کەسی نەدەکرد، دروستکردن و خواردنەوەی لە شوێنی تایبەت بوو، هەندێك شوێنیان هەبوو تیایدا ئارەقیان دەخواردەوە کە پێیان دەوت "الحوانیت" هەروەك لە دێڕی شیعریاندا هاتووە کە پێم وابێ خاوەنەکەی (طرفة بن العبد)ـە دەڵێت: إن تبغني في حلقة القوم تلقني وإن تلتمسني في الحوانيت تصطد

دەڵێت یان دەمبینی لەگەڵ کۆمەڵەکە دانیشتووم، ئەگەر لەوێ نەتبینیم ئەوا لە حانوتەکان بگەڕێ بەدوام دەمدۆزیتەوە کە سەرخۆشم-پەنا بە الله- کەوایە حانوتەکان کۆمەڵە شوێنێك بوون بۆ خواردنەوەی ئارەق

بەڵام بە هەمان شێوە خەڵكی ئارەقیان هەڵدەگرت لەماڵەكانیان بە بەڵگەی ئەوەی الله عز وجل كاتێك ئارەقی حەڕام كرد، صەحابە هەموو ئارەقەكانیان لە ماڵەوەیان ڕشت، نووسەرانی مێژوو و ژیاننامە باسیان كردووە كە ڕێگەكانی مەدینە ئارەقی تێدا دەڕۆیشت، كەوابوو لە قانونی جاهیلی دوێنێ بەر لەوەی الله عز وجل ئارەق حەڕام بكات، دروستكردنی هیچ یەكێك بەرهەڵستی لێ نەدەكرد و شوێنەكانی خواردنەوە هیچ كەسێك بەرهەڵستی لێ نەدەكرد و هەروەها كڕین و فرۆشتنی هیچ یەكێك بەرهەڵستی لێ نەدەكرد، لە قانونی جاهیلی ئەمڕۆش دەوڵەت ئەم بابەتەی لە ئەستۆ گرتووە، جا چەندین كۆمپانیا هەن سەر بە دەوڵەتن پێی دەوترێت كۆمپانیای بەرهەم هێنانی خواردنەوە غازیەكان و ڕوحیەكان (پێم وابێ بەم شێوەیەیە) - كحولی یان ڕوحی پێ دەڵێن هەندێك جار- ئەوە دەزانم كە غازی بریتییە لە بیبسی و پێكهاتەكانی بەڵام ڕوحی بە دڵنیاییەوە بەكاردێت بۆ سەرخۆشكەرەكان لە خواردنەوەكان -پەنا بە الله- ئارەق و ئەم جۆرە شتانە، جا ئەو كارگانە سەر بە دەوڵەتن، ئەوە دەوڵەتە كە ئارەق بەرهەم دێنێت كەوایە قانونی جاهیلی ئەمڕۆ ڕێگە بە دروستكردنی ئارەق دەدات بە بەڵگەی ئەوەی ئەو دەوڵەتەی حوكم بە قانون دەكات هەر ئەوە كە كارگەكان دەكاتەوە بۆ دروستكردنی ئارەق، سەبارەت بە شوێنەكانی كڕین و فرۆشتنی ئارەق ئەوا پێویست بە بەڵگەی زۆر ناكات چونكە شەقامەكان پڕبوونە لە دوكانەكانی فرۆشتنی ئارەق، وە ئەو كەسانەش هیچ یەكێكیان ناوێرێت بوتڵێك ئارەق بفرۆشێت مەگەر مۆڵەتی ئەنجامدانی پیشەی بەدەست هێنابێت، هەر بۆیەش فرۆشیارەكە مۆڵەتی ئەنجامدانی پیشەكەی لەسەر سەری هەڵواسیوە، جا ئەگەر یەكێك بچێتە ژوورەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ بكات لەسەر ئەوەی تۆ سەرپێچی قانونت كردووە چونكە ئارەق دەفرۆشی بێ ئەوەی مۆڵەتی قانونیت هەبێ بۆیە لەسەر سەری دادەنێت تاوەكو هیچ كەسێك بەرهەڵستی لێ نەكات.

كەوایە فرۆشتن بە هەمان شێوە بەناوی قانون و بە مۆڵەتێك لە قانونەوە، وە شوێنەكانی خواردنەوەی ئارەق ئەمەش ئاشكرا و دیارە -پەنا بە الله- لە هەموو پایتەختەكانی وڵاتانی موسڵمانان، ئێستا لە هەموو شارەكان لە زۆربەی شارەكان دوكان و شوێن هەیە بۆ خواردنەوەی ئارەق، كەواتە جیاوازی نیە لە نێوان قانونی جاهیلی دوێنێ و قانونی جاهیلی ئەمڕۆ لەم بابەتەدا لە حەڵاڵ و حەڕام، سەبارەت بە زینا وەك بۆم باسكردن ئافرەت لەو كاتەدا ئاڵایەكی دادەنا لەسەر دەرگای ماڵەكەی هەروەك لە فەرموودەی دایكمان عائیشە (رضي الله عنها) لە فەرموودەی موسلیم -رحمه الله- هاتووە، جا كاتێك خەڵك بیانویستایە بچنە نێو نموونەی ئەو ماڵانە ئەوا دەچوون بەبێ مۆڵەت وەرگرتن؛ چونكە ئافرەتەكە ڕایگەیاندبوو كە پیاوان وەردەگرێت هەروەك ناسرابوون بە داوێنپیس و لەشفرۆشەكان، ئەمە لە قانونی جاهیلی دوێنێ، بەڵام لە

قانونی جاهیلی ئەمڕۆ بابەتەكە ڕێكخراوە بەجۆرێك كە ئافرەتەكە ناتوانێت كاری زینا بكات تەنها دوای ئەوەی كۆمەڵێك ڕەزامەندی بەدەست دێنێت و لە پێشەكی وەزارەتەكانیش كە ڕازی دەبێت و پەسەندی دەكات ئافرەت مۆڵەتی زینا كردن بەدەست بهێنێت بریتییە لە وەزارەتی تەندروستی؛ چونكە مەرجی ئەو ئافرەتە ئەوەیە نابێت نەخۆشیێكی گواستراوەی هەبێت، ئەم كارەش تەنها لە ڕێگەی وەزارەتی تەندروستی دەكرێت، جا پزیشكەكان دەیپشكنن و بڕوانامەیەكی پێدەدەن لەسەر ئەوەی كە نەخۆشیە گواستراوەكانی نیە چونكە خۆی دەداتە دەست پیاوان جا ئەگەر نەخۆشیێكی گواستراوەی هەبێت مانای وایە ناشێت بۆ ئەوەی ئەم پیشەیە بكات، وە دوای ئەمە ئاسایش پێویستە ڕازی ببن چونكە ئەوان لەو داوێن پیسانە دەكەنە بەكرێگیراو بۆ هەواڵگری، وە هەروەها شارەوانی پێویستە ڕازی ببێت و پەسەندی بكات، بە هەمان شێوە هەموو دامەزراوەكانی دەوڵەت پەسەندی دەكەن، ڕووی لێكچوون ئەوەیە كە ئافرەتەكە لە جاهیلیەتدا ئاڵایەكی هەڵدەكرد، بەڵام ئافرەتەكە لە قانونی جاهیلی ئەمڕۆ هەندێك ڕاگەیاندنی تیشكی دادەنێت، كەوایە چ جیاوازیەكی هەیە! جیاوازیەكە ئەوەیە كە ئافرەتەكە ئەوكات ئەگەر سكپڕ بوایە ئەوا منداڵەكەی دەدایە پاڵ یەكێك، بەڵام ئافرەتی سەردەم لە قانونی جاهیلی ئەمڕۆ پزیشكەكان ئەم كێشەیەی بۆ چارەسەر دەكەن بەوەی حەبی ڕێگریكردن لە سكپڕبوونیان بۆ دابین كردووە، ئیتر سكپڕ نابێت كاتێك پیاوان دەچنە لای -پەنا بە اللە-، ئەوەش قانونی جاهیلی دوێنێ و ئەمەش قانونی جاهیلی ئەمڕۆ.

پێویستە ئاماژە بكەین بۆ بابەتێكی خەفەتبار بەڕاستی كە ئەویش ئەوەیە دەبینین ناوە مێژووییە ئیسلامییە بریقەدارەكان لەسەر نموونەی ئەم شوێنانە دانراون: یانەی شەوانەی ئیشبیلیە، یانەی شەوانەی قوڕتوبە، یانەی شەوانەی ئەندەلوس، یانەی شەوانەی غەرناتە، گاڵتەجاری لەم شێوەیەمان نەبینیوە، گەلێك گاڵتە و سوكایەتی دەكات بە مێژووەكەی وەك ئەوانە، وە بە بەرچاوی موسڵمانانی پیاو و ئافرەت، قوڕتوبە و ئیشبیلیە و غەرناتە یانەی شەوانە! ئێستا جیهاد كردن فەڕزە لەسەر تاك تاكەمان تاوەكو ئەو وڵاتانە بگێڕینەوە و ئازادیان بكەینەوە، بەڵام هەندێك نیشانەمان بینی بۆ لەشفرۆشەكان لە وڵاتەكەماندا ! وە لە بەرزترین شوێن لە باڵەخانە نموونەی ئەم ناوانە دەبینی و بە هەمان شێوە لەسەر سینەماكان و شوێنەكانی خواردنەوەی ئارەق، كەوایە هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان جاهیلیەتی دوێنێ و جاهیلیەتی ئەمڕۆ لە بابەتی زینا.

هەروەها لە بابەتی ڕیبا، لە پێشوودا لە قانونی جاهیلی ڕێگە درابوو بەوەی مامەڵە بكرێت بە ڕیبا و بەڵگەی ئەوەش كە باسم كرد لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)لە وتاری حەجی ماڵئاوایی فەرمووی:

" هەموو ڕیبایەك هەڵوەشاوەتەوە و یەكەم ڕیباش كە هەڵم وەشاندەوە بریتی بوو لە ڕیبای عەباسی كوڕی عبد المطلب"، ئەمە لەو مامەڵە كردنانە بوو كە قانونی جاهیلی دوێنێ ڕێگەی پێدابوو، وە لە قانونی جاهیلی ئەمڕۆ دەبینی بانكەكان هەن سەر بە دەوڵەتن و بانكی تایبەتیش هەیە سەر بە دەوڵەت نیە، جیاوازیش لە نێوان ئەم دوو بانكە ئەوەیە كە دەوڵەت ڕیبا دەدات لە یەك تا چوار و مافی داوە بە بانكە تایبەتەكانیش لە یەك تا حەوت بدەن، وە لە بابی بە هەڵەدا بردن و پوكاندنەوەی ئەم دینە لە دەروونەكان، ناویان ناوە لە ڕیبا بە جگە لە ناوی خۆی، ناویان ناوە "سوود" جا كاتێك دەڵێیت: فڵان سوودی وەرگرتووە، هیچ شتێك لە ناوەوەت ناجوڵێت، بەڵام كاتێك دەڵێیت: فڵان ڕیبا دەخوات، هەست بە كاردانەوە دەكەی لەناوەوەی خۆت بۆیە وشەی ڕیبایان مراندووە لە دەروونەكان و عەقڵەكان و دڵەكان، وە جێگرەوەیان هێناوە بۆ ئەم وشەیە و ناویان ناوە "سوود"، وە بیرت نەچێت كە شێخی ئەوان لەمەدا ئیبلیسە كاتێك بە ئادەمی وت: پێت بڵێم و نیشانت بدەم درەختی نەمری و موڵك و سامانێكی بێ بڕاوە كامەیە، الله عز وجل فەرمووی: ﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ ﴿٣٥﴾﴾[1]، ئەو ناوی لەو درەختە نا درەختی نەمری و موڵك، بۆیە شێخی ئەو كەسەی ناوەكان دەگۆڕێت ئیبلیسە، وە هەروەك ئیبن حەزم -رحمه الله- دەڵێت: "شێخەكەش جێی متمانە نیە"، هەروەها لە بابەتی تر، لە بابەتی كوشتن و جگە لەویش، جا ئەگەر بەراوردێك بكەیت ئەوا هیچ جیاوازیەك نابینیت لە نێوان قانونی جاهیلی دوێنێ و قانونی جاهیلی ئەمڕۆ.

بۆیە سیفەتی جاهیلی كورت نابێتەوە لەو حوكمانە، بەڵكو ئەم قانونانەی كە حوكمی پێدەكرێت بریتیین لە حوكمانێكی جاهیلی، بابەتی كۆتایی ئاماژەی پێدەكەم ئەویش بابەتی چینی سێیەمە ئەوانەی دەڵێن: ئیسلام سەرچاوەیەكە لە سەرچاوەكانی تەشریع، شتێكیان وەرگرتووە لە ئیسلام و شتانێك لە جوولەكە و شتانێك لە نەسارا و شتانێك لە جگە لەم دینانە، جا لە قانونی ئەمریكی و بەریتانی و هیندی و هاوشێوەی ئەمانە كۆیان كردووەتەوە، پاشان هەندێك شتیان لە ئیسلام وەرگرتووە، وەسفی ئەوانە چییە لە پەڕتوكی الله عز وجل ؟، ئەوانە پێشینیان جوولەكەیە، الله تعالى لە سوڕەتی (البقرة) دەفەرموێت:﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾﴾ ،

[1] [البقرة: ٣٥]

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بكەنەوە كاتێك پەیمانمان لە ئێوە وەرگرت كە ئیتر خوێنی یەكتر (بە ناحەق) نەڕێژن و یەكتر لە ماڵ و حاڵی خۆتان دەربەدەر نەكەن، پاشان بڕیاریشتان لەسەر ئەوە دا و لە كاتێكدا خۆیشتان شایەتی لەسەر ئەمە دەدەن * لەوەودوا ئێوە هەر ئەوانەن (ئاماژەیە بۆ جوولەكەكانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)) خەریكی یەكتر كوشتنن، دەستەیەك لە (خزمانی) خۆتان لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەربەدەر دەكەن پشتی یەكتر دەگرن دژ بە دەستەیەكیان بە تاوان و دوژمنایەتی، كەچی ئەگەر بەدیلی دەستی دوژمن بكەوتنایە ئەوا ئێوە فیدیەتان بۆ دەدان و ئازادتان دەكردن، لە حاڵێكدا دەربەدەركردنەكەیان لەسەرتان حەڕامە، كەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێكی (تەورات) هەبێت و بەشێكی تری باوەڕتان نەبێت؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان كە ئەو كارە دەكات جگە لە سەرشۆڕیی و سووكی نەبێت لە ژیانی دونیادا هیچی تر هەیە ؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێنرێنەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوایش بێ ئاگانیە لەو كارانەی كە ئێوە ئەنجامی دەدەن.

ئەوانە پێشینیان جوولەكەیە، ئیمامی قوڕتوبی -رحمه الله- لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت: "دەیانەوێت دینێك دروست بكەن بۆ كۆكردنەوە لە نێوان ئیسلام و یەهودیەت" دینێكیان داهێنا لە ئیسلام و یەهودیەت، ئەمە وتەی ئیمامی قوڕتوبی و وتەی جگە لەویشە، بە هەمان شێوە ئیمامی قوڕتوبی دەڵێت: الله چوار پەیمانی لە جوولەكە وەرگرت: پەیمانی یەكەم: خۆیان نەكوژن، پەیمانی دووەم: هیچ یەكێكیان جوولەكەیەك دەرنەكات لە ماڵەكەی، پەیمانی سێیەم: یارمەتی و هاریكاری هیچ كەسێك نەكەن كە جوولەكە دەربكات لە ماڵەكانیان، پەیمانی چوارەم: ئەگەر جوولەكەیەك بە دیل گیرا ئەوا فیدیەی بۆ بدەن، جا هەموو ئەو حوكمانەیان واز لێهێنا كە الله عز وجل پەیمانی لێ وەرگرتبوون لەسەریان و تەنها حوكمێكیان دەست پێوەگرت و حوكمەكانیان گۆڕی، الله عز وجل بۆ ئەوانە دەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾﴾

ئەم بابەتە تەواو دەكەین چونكە گرنگە لە دیداری داهاتوو بە ویستی الله تعالى، وجزاكم الله خیرا خیر جزاء وبارك فیكم.

وتاری

شێخ ئەبی عەلی ئەنباری - تقبه الله-

بەناونیشانی

دەستور.. حوکمانێکی جاهیلی

وەرگێڕانی

پێگەی ڕاستەڕێ

